## حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە (رضي الله عنه)

ناوی حاطیبی کوڕی عەمری کوڕی عومەیری کوڕی سەلەمەیە، باوکی زیاتر بە ئەبوو بەلتەعە ناسراوە،[١] رایەکیش دەڵێت بەڵکو باوکی هەر بە ئەبووبەلتەعە ناسراوەو باپیری ناوی عەمری کوڕی عومەیرە.[٢]

ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانەو هاودەم بە سەعدی مەولای کۆچی کرد بۆ مەدینە و کاتێك چوویە مەدینە لای مونذیری کوڕی موحەممەد دابەزی.[٣]

کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە، یان دەوترێت کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە.[٤]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هەریەك لە حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەو عوەیمی کوڕی ساعیدەی کرد بە

١ - أسد الغابة، ج1، ص 528.
٢ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج2، ص 4.
٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج3، ص 114.
٤ - أسد الغابة، ج1، ص 528
٥ - أسد الغابة، ج2، ص 353.

برای یەك،[١] بەڵام رایەکی تر دەڵێت حاطیب و رخیلەی کوڕی خالیدی کرد بە برای یەك.[٢]

حاطیب یەکێك بوو لە بازرگانەکان کە بازرگانی خواردەمەنی دەکرد، هەروەك یەکێك بوو لە تیرهاوێژە زۆر بەناوبانگەکان.[٣]

حاطیب بەشدار بووە لە غەزای بەدرو ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تردا،[٤] هەروەها لە رێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشدار بووە.[٥]

لە غەزای ئوحوددا حاطیب دەنگێکی بیست هاواری دەکرد موحەممەد کوژرا، حاطیب تەواو شڵەژا و گەڕا بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ) تا بینی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیبدایەو پێغەمبەر(ﷺ) دەموچاوی دەشوات، وتی ئەوە کێ وای لێکردیت؟ وتی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاص، ئینجا وتی ئەی عوتبە بەرەو کوێ چوو؟ ئەویش ئاماژەی بۆ کرد بەرەو کوێ چوو، ئەوەبوو حاطیب خێرا چوو تا خۆی گەیاند بە عوتبە و دای لە گەردنی و سەری و چەك و ئەسپەکەی عوتبەی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش

---

١ - سير أعلام النبلاء، ج1، ص 503، أسد الغابة، ج4، ص 337.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج3، ص 114.

٣ - سير أعلام النبلاء، ج2، ص 43.

٤ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج3، ص 114.

٥ - أسد الغابة، ج1، ص 528

(ﷺ) شتەکانی بەخشی بە حاطیب و نزای خێری بۆ کرد و دوو جار پێی فەرموو خوا لێت رازی بێت.[١]

له ساڵی شەشی کۆچیدا پاش گەڕانەوە لە حودەیبیە لە مانگی ذیلقەعدەدا پێغەمبەر(ﷺ) حاطیبی وەك نوێنەر نارد بۆ لای مقوقسی بەرپرسی ئەسکەندەریە،[٢] مقوقس بانگی کرد و وتی سەبارەت بەو هاورێیەت قسەم بۆ بکە، مەگەر ئەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نیە؟ حاطیب وتی با ئەو نێردراوی خوایە، وتی ئەی بۆچی کاتێك هۆزەکەی دەریانکرد نزای نەکرد لە هۆزەکەی خۆی؟ ئەویش وتی ئەی تۆ شایەتی دەدەیت عیسای کوڕی مەریەم نێردراوی خوایە؟ ئەی بۆچی کاتێك هۆزەکەی ویستیان لەخاچی بدەن بۆچی نزای نەکرد لێیان تا ئەوەی خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، مقوقس وتی زۆر جوانە، تۆ کەسێکی دانایت و لەلای دانایەکەوە هاتویت، ئەوەبوو بە حاطیبدا برێك دیاری نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، لەناو ئەو دیاریانەدا ماریەی قیبطی و سیرینی قیبطی نارد کە هەردووکیان خوشك بوون، لەگەڵ کەنیزەکێکی تردا، هەموو ئەوانەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٣]

١ - سير أعلام النبلاء، ج2، ص 44، قال الذهبي إسناده مظلم.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج1، ص 134.

٣ - أسد الغابة، ج1، ص 529.

حاطیب لەوێ کەوتە قسەکردن لەسەر ئیسلام بۆ ماریەو هانی دا تا موسڵمان بێت، ماریەش رازی بوو و موسڵمان بوو، ئینجا سیرینی خوشکیشی موسڵمان بوو.[١]

عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) من و زوبەیری کوڕی عەووام و میقدادی نارد و فەرمووی(انطلقوا حتى تأتوا روضة خاخ ، فإن بها ظعينة معها كتاب ، فخذوا منها)، (برۆن تا دەگەنە باخچەی خاخ لەوێ ئافرەتێکی لێیە کە نامەیەکی پێیە، ئەو نامەی لێ وەربگرن)، ئێمەش خێرا چووین تا گەیشتینە ئەوێ و بینیمان ئافرەتێکی لێیە، پێمان وت نامەکە دەرکە، ئەویش وتی نامەم پێ نیە، وتمان یان نامەکە دەردەکەیت یان بەرگت پێوە ناهێڵین–واتە بەزۆر خۆمان لێت دەسەنین–،[٢] ئافرەتەکە وتی مەگەر ئێوە موسڵمان نین؟ چۆن شتی وا دەکەن؟ ئەوانیش وتیان با موسڵمانین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین کە تۆ نامەیەکت پێیە، ئەوەبوو ئافرەتەکە نامەکەی لە پرچەکانی

---

[١] - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج8، ص 212.

[٢] - صحيح البخاري، الرقم 4037، صحيح مسلم، الرقم 4654، سنن أبي داود، الرقم 2293، سنن الترمذي، الرقم 3310، صحيح ابن حبان، الرقم 6592، السنن الكبرى للنسائي، الرقم 11135، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم 17138، مسند أحمد بن حنبل، الرقم 580، مسند الشافعي، الرقم 1388، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم 378.

دەرهێنا،[1] بینیمان لە نامەکەدا نووسرابوو: (لە حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە)، نامەکەی نووسیبوو بۆ بێباوەڕانێکی ناو مەککەو هەواڵی هەندێ زانیاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێگەیاندبوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی حاطیب ئەمە چیە؟) وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەلەم لێ مەکە، من کەسێکی پاشکۆ و بێدەسەلات بوم لەناو قورەیشدا، چونکە کەسێك نەبوم لە خودی قوڕەیشیەکان، تۆ کۆچەرانێکت لەگەڵە کە خزم و کەسیان هەیە لە مەککەو ئەو خزمانەیان ژن و منداڵ و ماڵ و سامانیان دەپارێزن، بۆیە منیش وتم مادەم هیچ کەس و پشتێکم نیە لەوێ با بەمە پارێزگاری لە خۆم بکەم، ئەمەشم هەرگیز لەوەوە نەکردووە کە وازم هێنابێت لە ئایینەکەم و لە رازیبوونم نەبووە بە کوفر پاش ئەوەی خوا ئیسلامی پێ بەخشیم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(أما إنه قد صدقكم)، (ئەوە راستی پێ وتن)، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێم بدە بدەم لە گەردنی ئەو دووڕووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(إنه قد شهد بدرا و ما يدريك لعل الله اطلع على من شهد بدرا فقال اعملوا ما شئتم قد غفرت لكم)، (ئەو بەشداربووی بەدرە، تۆ چووزانیت خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی بەدر و فەرموویەتی چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بوم)، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(يا ايها الذين امنوا لا تتخذوا عدوي

---

[1] - سير أعلام النبلاء، ج2، ص 45، قال الذهبي إسناده صالح و أصله في الصحيحين.

وعدوكم اولياء تلقون اليهم بالمودة وقد كفروا بما جاءكم من الحق يخرجون الرسول واياكم ان تؤمنوا بالله ربكم ان كنتم خرجتم جهادا في سبيلي وابتغاء مرضاتي تسرون اليهم بالمودة وانا اعلم بما اخفيتم وما اعلنتم ومن يفعله منكم فقد ضل سواء السبيل)،[١] ئەمەش هۆكاری دابەزینی ئەو ئایەتە بوو.[٢]

حاطیب بۆیە ئەم نامەی نارد چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی هێرش ببات بۆ مەککە تا فەتحی مەککە بکات، ئەوەبوو حاطیب ئەو هەواڵەی نارد، بەڵام خوای گەورە ئەو نهێنیەی ئاشکرا کرد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٣]

جارێك کۆیلەیەکی حاطیب هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای دژی حاطیب کرد و وتی بە دڵنیاییەوە حاطیب دەچێتە دۆزەخەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی(كذبت لا يدخلها أبدا، فإنه شهد بدرا و

---

١ - الممتحنة: 1.

٢ - صحيح البخاري، الرقم 4037، صحيح مسلم، الرقم 4654، سنن أبي داود، الرقم 2293، سنن الترمذي، الرقم 3310، صحيح ابن حبان، الرقم 6592، السنن الكبرى للنسائي، الرقم 11135، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم 17138، مسند أحمد بن حنبل، الرقم 580، مسند الشافعي، الرقم 1388، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم 378.

٣ - أسد الغابة، ج1، ص 529.

الحدیبیة)، [١] (درۆت کرد، هەرگیز ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە ئەو بەشداربووە لە بەدرو حودەیبیەدا).

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە دووبارە نێردراوی ئەبووبەکری صدیق بوو بۆ لای مقوقس.[٢]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا چەند کۆیلەیەکی حاطیب هاتن و سکاڵایان لە حاطیب کرد کە خەرجی کەمیان پێ دەدات، ئەوەبوو عومەری کوڕی خەتتاب حاطیبی بانگ کرد و سەرکۆنەی کرد لەسەر ئەو کارەی.[٣]

حاطیب دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا تا لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی سی کۆچیدا بوو،[٤] ئەو کات تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو، کاتێك

---

١ - صحیح مسلم، الرقم 4655، مسند احمد بن حنبل، الرقم 14196، صحیح ابن حبان، الرقم 4873، سنن الترمذي، الرقم 3881، السنن الکبری للنسائي، الرقم 8021، المعجم الکبیر للطبراني، الرقم 2995.

٢ - أسد الغابة، ج2، ص 241.

٣ - سیر أعلام النبلاء، ج2، ص 45.

٤ - الطبقات الکبری لابن سعد، ج3، ص 114.

**شۆڕدرا عوثمانی کوڕی عەففانی خەلیفەی باوەڕداران نوێژی مردووی لەسەرکرد.[١]**

**حاطیب کاتێك کۆچی دوایی کرد چوارهەزار دینار و درهەمی جێهێشتبوو لەگەڵ خانوویەك و بڕێك شتی تردا، چونکە ئەو بازرگانی دەکرد و خواردەمەنی و شمەکی تری دەفرۆشت.[٢]**

پەندو وانە:

**هاوەڵانی بەشداربووی بەدر یەکەم دەستەی پارێزەری ئایینی خواو موجاهیدی ناو ئیسلام بوون، ئەوان یەکلا کەرەوەی پێشرەوی ئیسلام بون وەك پێغەمبەر(ﷺ) لە نزاکانی رۆژی بەدریدا دەیفەرموو(اللهم إنك أن تهلك هذه العصابة لا تعبد بعدها في الارض)، (خوایە ئەگەر تۆ ئەم دەستەیە لەناوبەریت ئەوا ئیدی دوای ئەوە لەسەرزەویدا ناپەرسترێیت).**

**بەراستی هێندە بەسە بۆ هاوەڵانی بەدر کە پێغەمبەری خوا لێیان رازی بێتو نزایان بۆ بکاتو لەبەردەم خوادا ئەو شاهیدیەیان بۆ بدات کە ئەمانە پایەی پارێزگاری ئایینی خوان، خوای گەورەش لە وەڵامی نزاکانی**

---

١ - أسد الغابة، ج1، ص 529.

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج3، ص 114.

پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم ئایەتانەی دابەزاند: (إذ تستغيثون ربكم فاستجاب لكم أني ممدكم بألف من الملائكة مردفين وما جعله الله إلا بشرى لكم ولتطمئن به قلوبكم وما النصر إلا من عند الله إن الله عزيز حكيم).

لە فەرموودەیەکدا کە موعاذ لە ریفاعەی باوکیەوە (کە بەشداربووی بەدر بووە) دەیگێڕێتەوە دەڵێت جبریل (عليه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێی فەرموو (بەشداربوانی بەدر لەنێوتاندا چۆن سەیر ئەکەن؟)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لە بە فەزلترینی موسڵمانانن) یان وتەیەکی هاوواتای ئەوە، جبریلیش فەرمووی: (بۆ فریشتە بەشداربووەکانی بەدریش هەر وایە).[١]

ئەو فەرموودەی کە تیایدا پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی کۆیلەکەی حاطیبی دایەوەو فەرمووی((كذبت لا يدخلنها أبدا، فإنه شهد بدرا و الحديبية))، [٢] (درۆت کرد، هەرگیز ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە ئەو بەشداربووە لە بەدرو حودەیبیەدا) ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی فەزڵی بەشداربوانی بەدرو حودەیبیە، چونکە وەك پێشتر باسی فەزڵی بەشداربوانی بەدرمان کردووە،

---

١ - صحيح البخاري، الرقم 3790.

٢ - صحيح مسلم، الرقم 4655، مسند احمد بن حنبل، الرقم 14196، صحيح ابن حبان، الرقم 4873، سنن الترمذي، الرقم 3881، السنن الكبرى للنسائي، الرقم 8021، المعجم الكبير للطبراني، الرقم 2995.

بە هەمان شێوە بەشداربوانی حودەیبیەش فەزڵیان تایبەتەو خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت(لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً، وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً).[١]

واتە:(سوێند بە خوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لە ژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیاز پاکیو دڵسۆزی) هەر بۆیە ئارامیو هێمنیو ئاسوودەیی دابەزاندە سەریانو پاداشتی بە مژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە. هەروەها بەڵێنی چەندین دەستکەوتی زۆری پێداون، کە لە ئاییندەدا دەستیان دەکەوێتو وەری دەگرن، خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەستە بەسەر خوا نەناساندناو دانایەو دەزانێت چ کاتێك ئیمانداران سەر دەخات).

گرنگیدان بە بانگەواز و گەیاندنی پەیامی خوا سنووردار نابێت لە ئاست کات و شوێن و بارودۆخ و کەسەکاندا، بەڵکو لەهەر یەك لەو بارو جۆر و کاتانەدا بانگەواز دەبێت هەبێت و بەردەوام بێت، بەڵام چۆنێتی بانگەوازەکەیە گۆڕانی بەسەردا دێت نەك وەستاندنی بانگەوازەکە، دەبینین

١ - الفتح: 18-19.

حاطیب نێردراوی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بۆ لای پاشایەك، کاتێك ئەو پاشایە دیاریەکانی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە لەنێویاندا سێ کەنیزەك هەن، خێرا حاطیب یەکەم هەنگاوی ئەوەیە بانگیان دەکات بۆ لای پەیامی خواو چاوەڕوانی ئەوە ناکات بگەنەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا قسەیان بۆ بکات، بەڵکو هەر لە ڕێدا بەردەوام باسی ئیسلامیان بۆ دەکات و هانیان دەدات تا ئەوەی دواجار هەریەك لە ماریەو سیرین موسڵمان دەبن.

وردەکاری لە وەڵامدانەوەی گومانەکاندا زۆر پێویستە، بەتایبەت وەڵامێك کە خودی بەرامبەر بخاتە هەنگاوی بەرگریکاریەوە نەك لە هێرش بردن بەردەوام بێت، کاتێك مقوقس بەوە گومان لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) دروست دەکات کە بۆچی لە بەرامبەر خراپەی قورەیشیەکاندا پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێنەکردون و داوای لە خوا نەکردووە کە لەناویان بەرێت، خێرا حاطیب ژیرانەترین وەڵامی بۆ ئامادە دەکات کە پەیوەستی بکات بە ئایینی خۆیەوە، بە مقوقسی مەسیحی دەڵێت ئایا عیسای مەسیحیش هەمان شتی تووش نەبوو؟ کەچی هیچ نزایەکی نەکرد لە هۆزەکەی تا خوا رزگاری کرد.

هەروەها ئەم بەسەرهاتەی حاطیب لەگەڵ مقوقس بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەسیحیەکانی میصر جیا لە مەسیحیەکانی تری ناوچەکانی تری

بیزەنتە باوەڕیان هەبووە بە پێغەمبەرایەتی عیسای کوڕی مەریەم و عیسایان بە خوا نەزانیوە، چونکە دەبینین حاطیب دەڵێت بڕوات هەیە بە پێغەمبەرایەتی عیسای کوڕی مەریەم؟ واتە هەم پێی دەڵێت عیسا کوڕی مەریەمە نەك کوڕی خوا، هەم پێی دەڵێت عیسا پێغەمبەری خوایە.

هاوەڵان مرۆڤ بوون و هەڵەیان لێوەشاوەتەوەو بەدەر نەبون لە هەڵە، ئەمە بڕوای ئەهلی سوننەیە کە هاوەڵان مەعصووم نین، بەڵام هەر هەڵەیەك نابێتە پێوەر بۆ سفرکردنەوەی کەسێك، بەڵکو ئەگەر حاطیب هەڵەیەکی گەورەی کردووە، لە دوو لاوە پۆزشی بۆ دێتەوە، یەکەم نیازی پیس نەبووەو بۆ دژایەتی ئیسلام نەبووە، دووەمیش ئەو بەشداربووی دوو باری زۆر سەخت بووە بۆ خزمەتی ئیسلام کە خوا خۆی شایەتی داوە لەسەر گرنگیەکانیان، ئەوانیش بەدرو حودەیبیەن، ئەمە جگە لە غەزاکانی تریش.